شەکری روحم لە چای تالّی ژیانا وا توایەوە
نە من ئەوم شرین کرد و نە ئەو منی هێڵایەوە

نەدیم یاوەر

پێشەکی ...

لە دونیادا ئامرازێلیێك هەن کە مرۆڤ لە ریّگەیانەوە دلّ و دەروونی خالّی دەکاتەوە لەو پالّەپەستۆیەی کە بە هۆی واقعی تالّی ژیان کەلّەکە بوون و پەنگیان خواردۆتەوە ، شیعر یەکێکە لەو ئامرازانە چ لە رێگەی نووسینەوەی بێت یانە لە رێگەی خوێندنەوەی ، کە هەمیشە بۆتە مایەی ئارامی و هێوربوونەوەی روح و دلّنیا بوون لە هاتنەدی سبەینێیەکی باشتر ، ئەگەرچی ئەو شیعرە خەیالاّوی بێت و دوور بێت لە واقعەوە ، لەیرەدا دەکرێت و دەشێت بلّێین شاعیر رۆلّی ئیمام و رێبەرێك دەگێرێت لە نێو کۆمەلّگەدا و و پەراو و پێنووس دەکات بە مینبەرێکی پیپرۆز بۆ گەیاندنی پەیام و ئاراستەکردنەکانی ، شاعیر هانی تاك ئەدا بۆ گەشبینی ، رێنوێنی دەکا بۆ بە ئاگابوون لە واقعی تالّ و فەرامۆشکردنی ئەو واقعە ، دەستی دەگرێت تا لە جەنجالّی و ئالّۆزییەکانی ژیانی دوور بخاتەوە ، بەر لەوەی غەم و ناخۆشییەکان رایبچەلّەکێنێ شاعیر ئەو غەم و ناخۆشییانە دەخەملّێنێ و مەزەندەی دەکات ، هەر ئەوەش نا بەلّکوو غەم و ئازارەکان وەردەگێرێت بۆ سەمفۆنیایەکی ئارام بەخش دا ئێمەی خوێنەر پێی ئاسوودە ببین ، شاعیران وێنە و رووداومان بۆ دەکەن بە زمان و زمانمان بۆ دەکەن بە مۆسیقا و

مۆسیقامان بۆ دەکەن بە هاوەڵ و هاودەم ، لە ڕێگەی وشە و زمانی شیرینەوە تاڵییەکانی ژیانمان بۆ دەرەوێننەوە .

نەدیم یاوەر یەکێکە لەو شاعیرانەی کە خاوەن قەڵەمێکی ڕەنگینە لە وێناکردن و نەخشاندنی تابلۆی زمانی و خاوەن هەستێکی ناسکە لە بەرپەرچدانەوەی ڕۆژگار و خاوەن زمانێکی پاراوە لە دەربڕین و خاوەن زەینێکی ڕۆشنە لە درك پێکردنی واقع و بوواوی ئەم ڕۆژگارە ، لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە جارێك گوزراشت لە خواست و خۆزیەکانی خۆی دەکات و جارێکیش دەردەدڵی لەگەڵ ئێمەی خوێنەر دەکات لە دەرەنجامی نەهاتنەدی ئەو خواز و خۆزگانە ، من نامەوێ لەیرەدا ئەم چەند دێرەی کە دەینووسم پێوانە کردن و لە مەحەك دانی شیعرەکانی ئەم شاعیرە بێت ، نا ، بەڵکوو خواست و مەرامم ئەوەیە کە ئەم نووسینەوەیەم ببێ بە پردێ بۆ گەشتن بە ناو و ناوخنی شیعرەکانی ، ئەمەش لە ڕێگەی خستنەڕووی ئەو بنیاد و شێوازەی کە شاعیر هەژموونی کردووە لە نووسینەوەکانی دا .

**شعرییەتی شیعرەکانی نەدیم**

لە شیعردا لە پاڵ فەرهەنگە ئەدەبی و زمانییەکەوە هەندێ ڕەگەز و کەرەستە هەن کە شاعیران وەکوو دەرامەتێکی وێژەیی سوودی لێوە دەبینن لە بنیادنانی شیعرەکانیان ، هەر یەك لەو ڕەگەزانە گرنگی خۆی هەیە لە تۆکمەکردنی دەقی شیعری و پێگەی ئەو دەقە ، هەندێك لەو ڕەگەزانە ڕێسا و ئەزموونە و شاعیران پەیرەوی لێ دەکەن ، وە هەندێکیان بەدەر لە ڕێسا و ئەزموونەکە بە شێوەیەکی فیتری و خۆرسکی ئاوێتەی دەقە شیعرییەکان دەبن

، دەکرێت بلێین هەر یەکێ لەو رەگەزانە پەیوەندی بە ئەوانی ترەوە هەیە و لە باری و شیاوی ئاوێتەکردنیان پێکەوە شعرییەتی دەق دیاری دەکا ، هەر بۆیە شاعیر دەبێت هاوسەنگی لە نێوان ئەو رەگەزانەدا رابگرێت تا دەقێکی وەها بەرهەم بێنێت شیاوی ئەوە بێت ناوی لێ بنرێت شیعر .

وێنەی شیعری یەکێکە لەو رەگەزانە و گرنگییەکی ئەوتۆی هەیە ، بە جۆرێك کە روونی و ناروونی پەیام و مەبەست و ناوەڕۆکی شیعری لەسەر بەندە ، هەر ئەم رەگەزە فراوانی دیدگای شاعیر و توانستی شاعیرمان بۆ دەردەخات لە دنیا دیدەیی و خەملاندنی رووداو و وێنە هەمەچەشنەکانی دەوروبەری و لە چێوە گرتنی ئەو رووداو و وێنانە لە تابلۆیەکی زمانی دا کە دواجار ئێمەی خوێنەر لە رێگەی خوێندنەوەیانەوە بە چواردەوری ئەو شاعیرە ئاشنا دەبین و دەتوانین بزانین چ بووە و چ رووی داوە ، هەندێ وێنەی شیعری بەر هەستی و ماددین ، وێنای ئەو شتانەیە کە بە یەکێ لە ئەندامە هەستیارەکانمان هەستی پێ دەکەین ، وە هەندێکی تر هۆشەکین و لە رێگەی بیرکردنەوە و تێرامانەوە دەتوانین درکی پێ بکەین ، لەم دیوانەدا دەتوانین چەند نمونەیەك دەستنیشان بکەین کە سەلیقە و وردبینی شاعیر دەردەخات لە وێناکردن و نەخشاندنی وێنەی زمانی ، وەك لەم نمونانەی خوارەوە بەدی دەکرێت :

دڵم وەك چادری بەر با و رەهێڵە

بۆ سەد غەمی بێ جێ پەنایە ئەمشەو

ئەگەر دیقەت بدەین و لەم بەیتە ورد بینەوە ، دەبینین بە جوانی وێنەی رەشماڵێك دەخاتە روو لە دەشتێکی چۆڵ دا کە چۆن لە کاتی باو و باران دا

نشینەکانی پەنای پێ دەگرن ، شاعیر لێرەدا دڵ بەو چادرە دەچووێنێ و غـەم دەکاتە پەناهەندە ، ئـەم وێنەیـە وێنەیـەکی بەرهەسـتییە و بـەر هەسـتی بیـنین دەکەوێت و بینراوە .

هەروەها لە بەیتێکی تردا وێنەیـەکی بەرهەسـتی جـوان نیـشان ئـەدا کاتێـك دەڵێ:

**نەبیـستم گـوفتی شـیرینی نــە دیـم خەنــدەی دەم و لێــوی**

**نــەدیم خەنــدەی دەم و لێــوی سەرچــاوەی ئــاوی ژیــانە**

لەم دێرەدا هەر سێ هەستەکانی بینین و بیستن و چەشتنی بە شێوەیەکی جوان ئاوێتە کردووە و لــە پـاڵ ئەمەشــەوە ڕەگەزدۆزییــەکی ســاوێتەی لــە نێـوان وشەکانی ( نە دیم ـــــ نەدیم) درووست کردووە .

لە بەیتێکی تردا دەڵێ :

**لەســـایەی عەشـــقی تـــۆوە چـــاوانم دوو کانیـــە**

**بەس عومری من بەبادە ، چاوەکەم خـۆ کـا نیـە**

ئەگەر دیقەتی ئەم دێڕە بدەین وێنەیەکی بەرهەستی بینین و وێنەیەکی هۆشەکی تێدایە کە هەردووکی لە شکڵ و شێوە بە یەك چواندووە ، وێنە بەرهەستییەکە وێنەی شەن کردنی (کا)یە و ئەوی تریان بە با دانی عومرە ئەڵبەت ناکرێت و ناشێت تەمەن بەر با بکەوێت و هەستی بەرکەوتن بێتە ئاراوە ، بەڵام لـەیرەدا دەشێت بارێکی مـەجازی ئـەو بەرکەوتنـە درووسـت بکـات و لــە ڕێگــەی بیرکردنەوەوە هەست بەو وێنەیە بکەین .

وەك لـە سەرەوە ئاماژەمان پێ داوە ، وێنەی شیعری زۆرجار دیارخەری واقـع و ژیانی شاعیرە ، ڕوئیای شاعیر نیشان ئەدات لە ڕوانینـی بـۆ چـواردەور و

تەنانەت خوودی خۆیشی ، بۆیە دەبینین نەدیمی شاعیر لە چوارینێك دا رەنگ و رووخساری خۆی نیشانی ئێمەمانان دەدات و ئاوێنە دەکاتە بەهانە بـۆ ئـەو نیشاندانە ، کاتێك دەڵێت :

هــەرکاتێ دەچــمە بــەر دەم ئاوێنــە
بــۆ رووی ئاوێنـــە دڵــم پــڕ خوێنــە
یــاخوا ئاوێنـــە هـــەر مـــن بتبیـــنم
بـەو ڕەنگ و شێوە بەو حـاڵ و وێنـە

وێنەی شیعری لەم چوارینەیەدا راستییەکمان بۆ دەردەخـا کـە کـەم کـەسمان بوێری ئەوەمان هەیە بیدرێکێنین ، دەکرێت بڵێین لەیرەدا شاعیر لە بری ئێمـە سەیر دەکات و چاوەکانی خۆی خستۆتە گەڕ بۆ ئـەوەی ئێمـە ئـەو ببیـنین ، سەرەنجام پێمان دەڵێ کە بە سەر و سەکوتی خۆی رازی نییـە و ئـەو سـەر و سیمایە هی ئەوە نییە لێیّ بنۆڕین .

جگە لـە وێنەی شیعری رەگەزێکی تری شیعر مۆسیقای شیعرییە ، گرنگـی ئەم رەگەزە لـە وێنەی شیعری کەمتر نییە ئەگەر زیاتر نەبێت ، خۆ ئەگەر قـەد و قیافە و و بەدەنی شیعر لـە وێنە پێکهاتبێ ئەوا دەشێت بڵێین مۆسیقا روحـی ئەو کائنەیە و زیندوویی شـیعری لەسـەر بەنـدە ، مۆسـیقا نـەرمی و رەوانـی دەبەخشێ بە دێڕ و کۆپلە شیعرەکان لـە کاتی گۆکردن و خوێندنەوەیان دا ، پردێکە بۆ گەشتنی پەیام و مەبەستی دەق بە دڵ و دەروون و زهنی خوێنــەر و بیسەر ، مۆسیقا لـە شیعردا بە چەند شـێوازێك پێکـدێت ، لــە پـاڵ کـێش و

سەرواوە چەند ڕێگەیەکی تر هەن کە مۆسیقا بە بەیتە شیعر و کۆپلەکان دەبەخشن ، لەوانە دووبارەکردنەوەی دەنگ و وشە و گرێی هەئماواز ، هەروەها بەشێك لە هونەری جوانکاری وشەیی لە زانستی ڕەوانبێژی دەبێتە هۆی پێکهێنانی مۆسیقای شیعری ، لە شیعری کوردی دا مۆسیقای شیعری لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت ، مۆسیقای دەرەوە کە پێکدێت لە کێش و سەروا و قالب و چێوەی شیعر ، دووەمیان مۆسیقای ناوەوەیە کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێ داوە کە چۆن دروست دەبن ، نامەوێ لەیرە هەم باسی کێش و سەروا بێنمە ئاراوە ، چوون گەلێك جاران و لە گەلێك کتێب و نامەی ئەکادیمی و ووتار باس لەو بنیادە مۆسیقییە کراوە ، تەنها هەوڵ ئەدەم چەند نموونەیەك لە مۆسیقای ناوەوەی شیعرەکانی نەدیم بخەمە روو .

نەدیم یاوەر هەستی بە گرنگی ئەم رەگەزە شیعرییە کردووە ، جگە لە کێش و سەروا لە زۆر بەیت و کۆپلەدا مۆسیقای ناوەوەی دەق بەدی دەکرێت ، وەك ئاماژەشمان پێ داوە ، شێواز و چۆنێتی درووست بوونی ئەم مۆسیقایە فرەیە و دەکرێت لەیرە چەند نمونەیەك بخەینە روو .

- تەسمیت

پرسیم لە حاڵی کەناری بۆ لە باخ و گوڵ کەناری
حاڵی کردم بە بێزاری یەخەی چەرخی غافڵ دەگری

ئەگەر سەرنج بدەین لەم بەیتە ، دەبینین دابەشی چوار پارچە کراوە و سیانی یەکەم هەمسەروان و ئەوی تریان سەروایەکی جیاوازی هەیە کە بۆ شیعرەکە

دەگەڕێتەوە ، شێوازی دابەش کردنەکە بەم شێوەیەیە :

پرســـیم لـــە حـــاڵی کـــەناری
بـــۆ لـــە بـــاخ و گـــوڵ کـــەناری
حـــاڵی کـــردم بـــە بێـــزاری

یەخـــەی چـــەرخی غـــافڵ دەگـــری

ئـەم دابـەش کـردن و هەمـسەروا کردنـە ، جـۆرە مۆسـیقایەك بـە بەیتەکـە دەبەخشێ .

- ڕەگەزدۆزی

تەشـریفت بێنـە کـەلامت تەبـشیری بـۆ مـە هێنـابێ!
دەسا ئەجەل تخوا عەجەل لـەم ژینـە بێ ئەمـەل چ بکـەم

لـەم بەیتـە شـیعرەدا ، ڕەگـەزدۆزی ناتـەواوی جـودا لـە نێـوان وشـەکانی (ئەجەل،عەجەل،ئەمەل) مۆسیقایەکی هەمدەنگی دروست کـردووە ، هـەروەها لە بەیتێکی تردا دەڵێ :

باوەڕ مەکە ئەگەر لێوم گوڵی ئاڵی خەندە بگرێ
وەکـوو ژاڵـە نـاخم تاڵـە سـەمەرم ئـازار و ژانـە !

لەم بەیتەش دا ، ڕەگەزدۆزی ناتەواو لـە نێـوان وشـەکانی ( ژاڵـە ، تاڵـە ) هەمان ئاوازی بەیتی پێشووی درووست کردووە بە چەپکە دەنگێکی جیـاواز

، هەروەها دووبارەکردنەوەی دەنگی (لّـ) پێنج جار جۆرە ئاوازێکی تری بـە بەیتەکە بەخشیوە

- دووبارەکردنەوەی دەنگ

جـــۆش و خرۆشـــی گیـــانی لـــە خۆشـــی بـــەتاڵمی
ئـــــاوازێکی زوڵاڵـــی نێـــو گـــەروی شمـــــشاڵمی

لەم بەیتەدا ، دووبارەکردنەوەی دەنگی (ش) پێنج جار ، بۆتە هۆی دروست کردنی مۆسیقایەکی زەق و دیار لە نێو بەیتەکەدا .

- دووبارەکردنەوەی چەپکە دەنگ

ئای کە چەندە مەیلی پیاسەی زەردەی ئێواران دەکـەم
تاسـەی ژوانــی پـڕ لـە جـوانی یـارانی جـاران دەکـەم

ئەگەر سەرنجێ بدەینە ئەم بەیتە ، دەبینین دووبارەکردنەوەی چەند دەنگێك بـە سەریەکەوە لە چەند وشەیەکی جیاواز مۆسیقای بەیتەکەی دروست کـردووە ، ئەو دەنگانەش (انی)ە کە بە چەپکە دەنگ دەناسرێنەوە .

- کەرتکردن

جگە لە تەسمیت جۆرە کەرتکردنێکی تر هەیە لە سنووری وشە و دەستەوشـە خۆی دەبینێتەوە ، زۆرجار هاوسەنگ دەکرێن لە رووی کێشەوە بـۆ ئـەوەی مۆسیقایەکی تایبەتی هەبێت ، ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم بەیتەی دا دێ ئەوا ئەم جۆرە مۆسیقایە بەدی دەکەین :

به دوو تەریقەی جیاواز کەوتمه ڕێ نەگەشمه جێ

دەمــێ خــەوفی مــردن و دەمــێ غــەمی ژیــانم

لەم بەیتەدا ئەم دەستە وشانە (کەوتمـە رێ ـ نەگەشمـە جـێ ) دوو پارچـەی هەمئاوازن و بۆتنە هۆی دروست کردنی مۆسیقای ناوەوەی بەیتە شیعرەکە .

لە خوێندنەوەی شیعرەکانی دا ئەتوانین درك بەو بایەخەی نەدیم بکەین کە بە مۆسیقای زمانی داوە لە نووسینەوەی شیعردا ، هەر بۆیە دەبینین لە شیعرە سەربەستەکانیش لێرە و لەوێ لـە کۆپلەکانـدا جـۆرە مۆسـیقایەك بـەدی دەکرێت ،

بە نمونە :

شەوە ئازیز

شەوی پاییز

چرکە ماندوی ڕێگەی دوری دەقیقەیە

کات هێندە بێ سەلیقەیە

ناچێ بەدەم گزنگەوە

ئاخ بەدەس شەوە زەنگەوە

داری عومرم پەیتا پەیتا

لەبەر ڕەشەبای مەینەتا

گەلآی خەونی هەڵدەوەرێ
بێداری سەگێکی دڕە
تاکو بەیان پێم دەوەڕێ

گەر دیقەت بدەین لـەم کۆپلەیـە دەبیـنین لـە نێـوان وشـەکانی (دەقیقەیـە ـ سەلیقەیە ، گزنگـەوە ـ زەنگـەوە ، هەڵـدەوەرێ ـ دەوەڕێ) رێکەوتەیـەکی مۆسیقی جوان بەدی دەکرێت و وشەکان لـە رێگـەی ئـاوازەوە بـە یەکـەوە گرێ دراون و بە یەکا چوون .

گرنگیدانی نەدیمی شاعیر بەم دوو رەگـەزە شـیعرییە لـە جێـی خۆیـەتی و بەجێیە ، چونکە نەمری شیعر لە سەر ئەم دوو رەگەزە بەندە ، تام و چـێژ و بەها و سەنگ و کاریگەری دەقی شیعری دیـاری دەکـەن ، دەمـەوێ لـەیرە کۆتایی بەم نووسینە بێنم لەبارەی رەگەز و بنیـادەوە و ئـەوەی ماوەتـەوە بـۆ ووتن بۆ خوێنەری جێ بێڵم ، هەر ئەوە ماوە بیلێم کە ئـەم دیوانـە شـیعرییە لە رووی قالبەوە لە ( غەزەل و جووت سەروا و تـاك و چـوارین و شـیعری ئازاد) پێکهاتووە ، کە ئەم فرە قالبییەش تایبەتمەندی و چێژی خۆی هەیـە بـۆ خوێندنەوە و رێگرە لە بێزار بوونی خوێنەر لە ریتم و قـالبێکی چـوون یـەك لەخوێندنەوەی دا .

م. بێستون یوسف (هەژارە)
٢٠١٩/٢/١٥

کورتەیەك لە بارەی شاعیرەوە ...

## بەناوی خودای بیێ هاوتا

من ناوم (ئاراس یاوەر محمد)ە ، ساڵی ١٩٨٦ لە سلێمانی لە گەڕەکی ئابلاخ لەدایك بووم ، خوێندنی سەرەتاییم لە قوتابخانەی میدیا تەواو کردووە و دوواتر چوومەتە قوتابخانە زانیاری ناوەندی ، بەداخەوە نەمتوانی سەرکەوتوو بم و لەخوێندن بەردەوام بم لەبەر چەند هۆکارێ ، هەر لەسەرەتاوە حەز و خولیام بۆ شیعر هەبوو تا ئەو کاتەی دەستم دایە خوێندنەوەی دیوانی شاعیرانی کلاسیك وەك و نالی و مەحوی و زۆرینەی شاعیرە کۆن و نوێیەکان ، ئەدەبی فاریشم کەمێك خوێندۆتەوە وەك خییام و حافز .

نەدیم ناسناوی شیعریمە و بە واتای پەشیمان یاخود هاودەم دێت ، خۆم ئەو ناسناوەم هەڵبژاردووە و پێم خۆش بوو ،وەك هەموو کەس سەرەتا بە کرچ و کاڵی دەستم بەنووسین کرد ، بەڵام بە تێپەڕبونی کات و خوێندنەوەی زیاتر و رەخنەی هەندێ هاوڕێی شارەزا هەست دەکەم گۆڕانکاریم بەسەردا هاتیێ .

من پێم وایە جیاوازی نێوان کەسێ کە بۆ حەز و ئارەزوو شیعر دەنووسێ و کەسێ ئازار و خەم و تەنیاییەکان وای لیێ دەکەن شیعر بنووسێ زۆر زۆرە ، هەندێ شیعر دەنووسن هەندێك شیعر دەیان نووسێتەوە ، من پێم وایە ئافرەت چۆن ژان دەیگرێ منالێك دێنێتە دونیاوە شاعریش دەبیێ دڵی ژان بگرێت بۆ ئەوەی شیعرێکی جوان و تەندروست بێنێتە دونیاوە ، نەك خۆت

دوای ئیلهام بکەویت بەڵکو ئەو ئیلهامە جێگە دەگرێت کە خۆی لە دەرگای دڵت دەدات ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کارێك بێ کەم و کورتی نییە و مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ قسەی دڵی خۆی بە تەواوی بکات هەروەك چۆن گۆرانی شاعیر دەڵێت :

هەرچەن دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوە هەڵبەستم

نەدیم یاوەر
٢٠١٩

## ﴿ غەزەل ﴾

﴿ ١ ﴾

باسی دەریایە فرمێسك بە دڵۆپێ حیبر ناکەم
ئەلەم هەمو ئەلەمەدا قەڵەم ناچار شیعر ناکەم

بە ئەمری بڕۆی کەوانی کە ئیمای بڕۆیان فەرموو
ناچم و خۆم تووشی داوی چاوی پڕ لە سیحر ناکەم

ڕاستە وتم دەبمە شانە لەبۆ زوڵفی پەرێشانت
ئەمما نابم بە ئاوێنەت ئەمن حەز بە کیبر ناکەم

لەدووری جەماڵی شێوەت چاوم سپی و بەختم ڕەش بوو
باسی یەعقوب لەکەنعان و زوڵەیخا لە میسر ناکەم

لەوەتەی بوومە دەروێشی تەریقەی عیشقی پڕ ئێشت
بەکوڵ و بەدڵ دەناڵم تاوێ فکری زیکر ناکەم

﴿ ٢ ﴾

دڵـم بـۆ خـەزانی عـومری بـەهاری وا بـە کـۆڵ دەگـری
تۆش لـە پـایزی تەمـەنتا وەك هـەنار تـازە گـوڵ دەگـری

مـن داری عـومری بـێ بـەرم بـوو بـە گۆچـان و ڕێبـەرم
تۆش وەکوو مێوی نەرم و نۆڵ پەل ئەهاویت و چڵ دەگری

مـن لـە تـەختی کێلـی سـینەت وەفـاتم دەنووسمـەوە
ئـەتۆش لـە دڵـی سـووتاوم بـۆ چـاوەکانت کـل دەگـری

مـن ئـەوا لـە خۆشـی شـەوقی شـەمی خۆمـا سـیا ڕۆزم
تۆش بۆ بولبولی خۆش خوانت ئەی بێ وەفا چقڵ دەگری

پرسـیم لـە حـاڵی کـەناری بـۆ لـە بـاخ و گـوڵ کـەناری
حـاڵی کـردم بـە بێـزاری یەخـەی چـەرخی غـافڵ دەگـری

ئەرێ چییە ناڵـەی قـومری نـە وەك ڕۆژێ هـەموو عـومری
وەك خەندەی نـەدیم حەزینـە بۆیـە ئـاوا بـە دڵ دەگـری

﴿ ٣ ﴾

مـن لـەتۆماری نـەهاتی بـەختی سـەختی ئـەزەل چ بکـەم
لەدەرچـــونی روحـی نـامۆ و لەنـەهاتی ئەجـەل چ بکـەم

بـــەغەیری تـالّی نەمـــدیووە دەوایـــە هـــەبێ بـۆ دەردێ
دەپـێم بلّـێ کەمـەی نـەبێ لـە شـیرینی عەسـەل چ بکـەم

کەدی ڕەقیب شـیعرم مـەدحی جـوانی یـارە.روون دیـارە
وتـــی مـــن غـــەزالم هـــەبێ لـــەڕەوانی غـــەزەل چ بکـــەم

بـەیارم وت کـەدڵ جێتـە ، فـەرموی تەماشـا ئـەم شـێتە
لەبـەیتی پـڕ لەئـەحزان و خـاپور و بـێ عەمـەل چ بکـەم

تەشـریفت بێنـە کـەلامت تەبـشیری بـــۆ مـە هێنـابێ!
دەسا ئەجەل تخوا عەجەل لەم ژینـە بـێ ئەمـەل چ بکـەم

﴿ ٤ ﴾

لــەحوجرەی دڵــی تــەنگما پەپولــەی ئیلــهامم ســوتا
قەســیدەم بــووە بــە تــاڵێ لــەنێو دوکــەڵی گێــسوتا

لەسـەختی بـەختم قـەتران و لـە تەئـسیری خـەیاڵم خـاو
بۆیـە هـەردەم پەرێـشانە بـەسەر چـرای گەشـی رووتـا

سـەرم سـوڕماوە نـازانم لەعـەقڵی خـۆم بـەگومانم
تـۆ کـە خـۆر بویـت مـنی سـایە لەبەرچـی هـاتم بـەدووتا

بـەڵام گیانـە لـەچ عـەقڵێ بیـستراوە وەهـا نـەقڵێ
وەك شـێت نـەهاتبێ بـەدووی دوو چـاوی پـڕ لـەجادوتا

وەك گەنجینـەی نێـو کـەلاوە دیـوانێکم حەشـار دراوە
ئـەو هـەمو وشـە ناسـکە لـە پـەرتوکێکی پـەرپوتا

﴾ ٥ ﴿

تـــۆ خـــەیاڵی شـــیرینی نێـــو ژیـــانی تـــاڵمی
لـــەدڵ چـــرۆی ئـــاوات و لەچـــاو ئەشـــکی ئـــاڵمی

شـــەرابی نێـــو ســـەرابی چـــۆڵی وشـــکە ســـاڵمی
کـــۆدی ڕســـتەی زمـــانی پـــڕ هـــاوار و لاڵمـــی

جـــۆش و خرۆشـــی گیـــانی لـــە خۆشـــی بـــەتاڵمی
ئـــاوازێکی زوڵاڵـــی نێـــو گـــەروی شمـــشاڵمی

گـوڵی ئـاڵی بـێ خەوشـی حەوشـەی چـوکی مـاڵمی
هـــیلالی بـــەر دەلاقـــەی ئاسمـــانی ســـاماڵمی

ئەگەرچـی پـشتم کەچـی بـاری سـەختی جەفاتـە
بـــە قوربـــانی وەفـــاتم گـــەر حـــاڵی بـــە حـــاڵمی

مـــن بۆیـــە بـــەم پیرییـــە دێـــم بـــەرەو پیریتـــەوە
هـــەڵگری نـــازی دڵـــی بـــێ مـــەئوا و منـــاڵمی

لەوســـاوە چـــاو لەســـەیری خـــاڵی لێـــوت خاڵییـــە
برینێـــکی بـــە ئێـــشی ســـینەی پـــڕ زوخـــاڵمی

﴿ ٦ ﴾

دڵ کە گڵکۆی خەونەکان و شـــاری گـەورەی خەمەکانـە
هەقتـە جێـی بێڵـی ئـەزیزم جێگـەی گـوڵ لــە گوڵـستانە

تـۆ لـە ئەشـکی چـاوەکانتا هــەزار ئـاوات بـەدی دەکـرێ
منــیش خەنـــدەم هـــەڵقوڵاوی دەروونـــی پــڕ لـــە گریانــە

بـاوەڕ مەکــە ئەگــەر لێــوم گــوڵی ئـاڵی خەنــدە بگــرێ
وەکـــوو ژاڵـــە نـــاخم تاڵـــە ســـەمەرم ئـــازار و ژانـــە !

سێبەریـشم لـە دووم نایـە هێنـدە سـەختە رێگـەی ژیـنم
کـانی ئـەوینی تـۆش بـۆ مــن هــەر سـەراب و بیابانــە

دوکـــەڵی ئـــاهی دەروونمـــە گرتوویـــە چـــرای جـــەماڵت
یـاخود زوڵفـە بـــەسەر کـــوڵمی گەشـت دا وا پەرێـشانە

کوڵمــە یــا ئـــاوێنەی دڵــم بــەو شــێوە خــوێنی تێــزاوە
نەخێر گەر ئاوێنەی دڵ بـا رەحمـی بـوو بـە جـەرگی شـانە

بـــە ماچـــی لێــوی شــیرینی دەیکــرد ســاڕێژی برینـــی
نـــەك بـــەتیری چـــاوی مەســتی لێـــی بگرێتـــەوە نیـشانە

ئەگەرچـی دەزووی ئیلـهامم ناچـێ بـەدەرزی هەڵبەستـــا
گـــەر درزی ســـینەت ببیـــنم دەبمـــە شـــاعیری ئەفـــسانە

نەبیـستم گـوفتی شـیرینی نـە دیـم خەنـدەی دەم و لێـوی
نـــەدیم خەنــدەی دەم و لێــوی سەرچـاوەی ئـاوی ژیـــانە

﴿ ٧ ﴾

مـن لــــه خۆشـی کــەلامی شیــرینی تــۆ بـیٚ زارم
زارت هەڵبێنـــه قوربــــان لــه بـیٚ دەنگـی بێــزارم

بــومه دیــلی عەشـقی تـۆ ئــەشك ڕیتنــه کـــــارم
وەك تــوتی نـــاوی تۆیـــه هــەم و قــسەو گوفتـــارم

تـــا نەبومــه شـەهیــدی غــەمزەی چـــاوی بیمــارت
جــــاریٚ بـه شـەهدی لــەبت بکـه عـیلاج و چـــارم

مورژگـــانی پەیــاپەی تــۆ ســینەمی کـردۆتـــه نــەی
گـــەر دەم بنێیـــه دەمــم پــڕ ئـــــاوازە هـــاوارم

گـــەرچی زەردە ڕوخــسارم وەکــو هــەوری بـــەهارم
بـۆ خەندەیــەکی لیٚـوت دەبمــه بـــارش دەبــــارم

گەرچـی ئـەو بـووە بـاڕەش وەرانـی خونـچەی حـەزم
وەلــیٚ بـشم سوتێنـــیٚ دەبمـــه (بـۆ) بـۆ نیگــــارم

﴿ ٨ ﴾

نیـــوه شـــەوه هەمیـــسان کەســـێ نیـــە بمـــدوێنێ
نـــە خـــۆر وادەی ڕۆژ ئـــەدا نەخروســـێ دەخـــوێنێ
کانی و چـەمان لەخـەودان تاقگـەی چـاوی مـن نـەبێ
دەگـری بـۆ ژیـنی سـبەی پـڕ بەسـەرهاتی دوێـنێ

خەمت خەوی لێ سەندم عەشقت ئەشکی پێ بەخشیم
لـــەپێناو خونـــچەیەکدا دیـــدەم گـــوڵ دەبـــارێنێ
گـوێ بـدە دەنگـی دەف و ناڵـەی دەروێـشانی دڵ
خـودا ئـەم تەکیـە کۆنـە بـۆ زیکـری خـەم بمـێنی

هەناســەو ئـاهی سـاردم سـەحرا پـڕ تـەرزە دەکـا
گـــڕی دڵـــی پەروانـــەم ســـەد شـــەمع دەســـوتێنێ
وا شــــەوگاری درێـــژم دەمداتـــــە دەس ڕۆژی ڕەش
دەبێ چاوەڕێی کەی کەم..کە بـەیان تەشـریف دێـنێ

﴿ ٩ ﴾

لەسایەی عەشقی تۆوە چاوانم دوو کانیە
بەس عومری من بەبادە ، چاوەکەم خۆ کا نیە

دڵ لەسەر پشکۆی فیراقت وەك سەماوەر هاتە کوڵ
بێرەوە چایی بەبێ شەکری لێوت چانیە

مانگ و ڕۆژ لەجەمالا ئەستێرەی سەر شانیە
ئەستێرەی شانی نەبێ هەرگیز لەلام شا نیە

خەیاڵی دڵ بولبولی بەر حەوشە و دەمبانیە
کێ دەڵێ لە خەیاڵیا دڵ گەلاّی دەم با نیە

سینەم میزانی ئەوینی بێ غەش و یەکسانیە
بێرە ئامێزم ببینە سەنگی خۆت یەك سانیە

بێ تۆ ئاوەدانی شار و کۆڕ و مەجلیسی ئەوین
لەبۆ من گۆڕێکی تەنگە هیچ کەسێکی تیا نییە

﴿ ١٠ ﴾

ئەی جەستەی کەسیرە بووی بەر بارانی چاوانم
هاکا سوتای بە ئاگری بەدی کردەوەکانم

چۆن عبورکەم لە پردی سیراتی تیژ و باریك
کە لە زەوی بەرینا لەنگە هەنگاوەکانم

بێداری مەسئەلەی ژین نوستووی تاعەت و دینم
دیلی نەفسی نەفیس و کۆیلەی ئارەزوەکانم

گرفتاری زوبان و گرفتاری بێ کردارم
بە بۆنەی زوبانەوە ئێستاکە بەستەزمانم

بە دوو تەریقەی جیاواز کەوتمە ڕێ نەگەشمە جێ
دەمێ خەوفی مردن و دەمێ غەمی ژیانم

تۆ راستی و ڕاستت دەوێ دەستی راستم کافییە
خودا ئەو دەستە ببڕی زەرەرمەندە بۆ گیانم

هەرچەندە گوناه کارم بەس تەوحیدە شیعارم
مستەحەقی جەننەتم تۆ دانا من نادانم

لێرە غەرقی ئەسرین حەریقی ئاگری نەدەم
لەوێ غەرقی بەزەیی بەحری ڕەحمی یەزدانم

﴿ ١١ ﴾

شـــەوی دەیجـورە یـا یەڵدایـە ئەمـشەو
کەخۆری رووت لەرووم هەڵنایـە ئەمـشەو

دڵــم وەك چــادری بــەر بــاو و ڕەهێڵــە
بۆ سەد خەمی بێ جێ پەنایە ئەمشەو

دڵـــیش مایـــل بـــە دیـــدە غەزالێکـــە
لــەمن بۆیــە وێڵــی ســـەحرایە ئەمــشەو

کەســـەرم پــڕ کەســـەری عەشــقی تۆیــە
چ بـاکم تــەخت و تـاجی شـایە ئەمـشەو

نایە پەنجەی سەر سینەیی کون کونم نێ
لەنــەی بــێ ڕۆح نایــە ســـەدایە ئەمــشەو

موســـوڵمانان دەپرســـن حــاڵی (نــەدیم)
ئــەژنۆی خــەمی لــە ئامێزدایــە ئەمــشەو

﴿ ١٢ ﴾

ئای کە چەندە مەیلی پیاسەی زەردەی ئێواران دەکەم
تاسەی ژوانی پڕ لە جوانی یارانی جاران دەکەم

گەر دەڕێژم ئەشکی چاوم بەسەر سینەی ڕێشما
بیری بۆنی خاکی پاك و ڕێژنەی باران دەکەم

گەرچی شابالّی ئەمەلی شکاندم بەردی زەمەن
وەك مەلێ ئێستەش خەیالّی پۆلی هوزاران دەکەم

مێوی بالاّم داچەمیوی هێشووە ترێی مەینەتە
لە بۆ سوك باریيە یاری ساقی و مەیخۆران دەکەم

من کە فرهاد بوم ئەمێستا ڕۆستەمی مەیدانی غەم
کامە کێشە زۆر بە ئێشە لەگەلّیا زۆران دەکەم

گەر بدا مەودا فەلەك پێم بەردی بەردێ کەم کەلّەك
قوڕ بەسەر ژینی پڕ شینی بێ هەستی شاران دەکەم

﴿ ١٣ ﴾

ئـەی گـوڵ ئەگـەر بمـدوێنی ، چ دەبـێ ؟
بـە رووما خەنـدە بنـوێنی ، چ دەبـێ ؟

کۆرپـــەی دڵـــی ورِك گرتـــووی هـــەتیوم
لـە نـوێنی سـینەت بنـوێنی ، چ دەبـێ ؟

کــە تــۆی مێــراوی دێــراوی دوو دیــدەم
تــۆوی شــادی کـە بڕوێنــی ، چ دەبــێ ؟

لــە کێـوی پــڕ نـشێوی سـەختی تەمـەن
تـــەمی ماتـــەم بڕەوێنـــی ، چ دەبـــێ ؟

تـــا نـــەژاکاوە گـــوڵی دڵـــم بـــە خـــەم
خونچەی بـەختم بخـەملێنی ، چ دەبـێ ؟

ئــەرێ ئــەی قیبلــەگای ئــەوینی نــەدیم
لە من روو وەرنەچـەرخێنی ، چ دەبـێ ؟

## ﴿ جووت سەروا ﴾

﴿ ١ ﴾

بەهار و هاوین ، پایز و زستان
لە تاقی دڵما لەیەك تاقمان

بەهار بارانی تاو تاوی چاوم
هاوین دەرونی وشك و سوتام

پایز ڕوخساری خەزان لە بەرم
زستان بەفران بار مووی سپی سەرم

سەمەری عومرم سەمەرەی پیری
تەمەن كەوان بوو گەنجی بوو تیری

چەندە زوو ڕۆیی دەرچوو لە كەوان
نەیپێكا ئامانج خۆم بوومە نیشان

﴿ ٢ ﴾

خۆزگە لەپی دەستی چەپم
هەردی پەڵە گەنم دەبوو
خۆزگە هەوری چاوەکانم
هەمیشە پڕ لە نم دەبوو

بەدەستی ڕاست دەمدوریەوە
دەمدایە هەرچی هەژارە
لەسەر شانیانم دادەگرت
باری مەینەت و پەژارە

بەڵام ئەفسوس خۆم پوشێکم
چاوم وا بەئاسمانەوە
هەردەم چاوەڕێی بەهارم
لەبۆ ساتێ ژیانەوە

﴿ ٣ ﴾

ویستم پەیکەرێ لەبەفر
بکەم بۆ شێوەی بێگەردت
بەڵام هیچم بەرچاو نەکەوت
داینێم لەجێی دڵی بەردت

ترسام کەهەر چوار وەرزەی ساڵ
ببن بە زستان و سەرما
خۆریش خۆی بشارێتەوە
چیدی هەڵنەیە لەشەرما

﴿ ٤ ﴾

ئاوێنەکەم دە پێم بڵێ
تۆ هاوڕێی ڕاست و یەك ڕەنگی
بۆ هەر کاتێ کە دەتبینم
وا لێو بەبارو دڵ تەنگی

مەگەر تۆ وەك من بەبەردی
دەردی زەمانە شکاوی
لەبن سەقفێکی بێ هەست و
چوار دیوارا بەند کراوی

تۆ دەستی لەرزۆکی پیری
پرچی سپی شانە کردوی
تیرو تانەی یارو ئەغیار
دڵی بە نیشانە کردوی

تـــۆ تـــاڵی ســـپی پــڕ تـــاڵی
ڕۆژگـــــار کەوتۆتـــــە ڕدێنـــــت
بـــوکی پـــەژارە دوو دەســـــتی
گرتـــووە لـــە خەنـــەی خوێنـــت

ئاوێنەکـــــەم دەپــــێم بلـــــێ
چ ڕازێکـــــــی بـــــە ئـــــازارە
دەســــتی بێـــدەنگی ناوەتــــە
بینـــــە قاقـــای ئـــەم ئـــازارە

﴿ ٥ ﴾

مـــن پـــەرتوكێكی پـــەڕپوتم
لـــــەتاقی ژوورێكـــــی چـــۆڵاً
پـــەڕەم پـــڕە لەشـــیعری جـــوان
بـــەرگم دیـــار نیـــە لـــەخۆڵاً

وشـــــــەكانم پەپولـــــــەن و
بـاس لەقەشـەنگی گـوڵ دەكـەن
وەلـــێ ئەفـــسوس شـــەوارەن و
لەتیـشكی هــەتاو سـڵ دەكـەن

چونكە تیـشكی شـەبەق هـەرگیز
لەپەنجـــــەرەی ژورم نــــــادا
نیــە دەســتی ئومێــد پــەردەی
تـــەمی خـــەمی لـــە روو لادا

ڕەنگــــــە ڕۆژێ ڕەشــــــەبایەك
دەرگــــــای ژورم بکاتــــــەوە
تــۆزی ســەر بــەرگم بــسڕێت و
پــــــەڕەکانم هەڵداتــــــەوە

حەزدەکــەم یەکــەمین کەســێ
کــــــەدێت و دەمخوێنێتــــــەوە
برینــی کــۆنی ئــەم بەیتــەم
ســــــەرلەنوێ بکولێنێتــــــەوە

تــەنیا تــرم لــەو گەڵایــەی بــا وەرانــی
بــێ حەواســم وەکــوو چــاوی چــاوەڕوانی

﴿ ٦ ﴾

ئەمشەو خـەمێ یەخـەی گرتـووم
خـــەو بەســـەرم ناکاتـــەوە
کوانـــوی ســینەم بلێسەی دێ
رووحـــم گـــەرم نـــاکاتەوە

لەسوچـــێکی ئـــەم ژورەدا
لـــەم دەیجـــورە بـــێ نـــورەدا
لـــەژێر بـــاران و چـــەخماخەی
هـــەوری غـــەمگین و تـــوڕەدا

دەســـتم پێوەنـــدی ئەژنۆمـــە
پەنجـــەکانم دەســـتە مۆمـــە
خـــەم باڵـــداری کەســـیرەبوی
پـــەڕ شـــکاو و دەســـتەمۆمە

ئـــــازار وەك گوڵـــــــە لاولاوێ
بــــەباڵای رووحمــــا ئــــاڵاوە
ئاسمـــان تـــاجی تـــەمی خـــەمی
تـــــەنیایی لەســــــەرم نــــاوە

بەزامـــــــــداری لـــــــەنێوانی
مـــــردن و ژیانــــا کـــــەوتووم
هیـــــچیان نایـــــەن بەلامـــــەوە
هـــــەردوو وادەزانـــــن مـــــردووم

## ﴿چوارینەکان﴾

﴿ ١ ﴾

کێ وەکوو تۆ دەریا گەرووی وشك کرد
کێ وەکوو من سەحرای پڕ لە ئەشك کرد
ئەم مەرگە بە ئازارەی تۆی پەپولە
یەقینێ بوو ژیانی پڕ لە ((شك)) کرد

﴿ ٢ ﴾

بە ئەشقی تۆوە سەرگەرم و مەستم
هەر وەسڵی تۆیە هەموو مەبەستم
تۆ کە لە دڵمای ناچمە هیچ جێیەك
نەك دڵ لە جێیەك دەرچێ لە دەستم

﴿ ٣ ﴾

سـەبر بـێ سەبـــرە ڕۆیــیوە لـــە لام
دەنـا لــە ئـــازار مـن دەچێــژم تــام
ئــەشکێ بـە ئەشـقی تـۆ بـێ لــە چـاوم
نـایـدەم بـە قاقـای سـەد گێـل و نەفـام

﴿ ٤ ﴾

ســاقی دەغــیلم لــەو ئــەشکی مێــوە
بــۆم تێکــە جــامێ حـــاڵم پەشــێوە
ئـەم خوێــن ڕژانـــەی کـە تـۆ دەیبینـی
لــە ســەر خــواردنی تــەنها یــەك سـێوە

﴿ ٥ ﴾

دڵـــم بۆتـــە گـــوڵی ژاکـــاوی دەم بـــا
مــەرگ لــە چــاکی خۆیــە دێــت و دەم بــا
ئەو دەمانــەی کــە دەس لــەملانی تــۆ بــووم
هەموو عومرم خۆزێ کـە هـەر ئـەو دەم بـا

﴿ ٦ ﴾

هەنــدێ کــەس دەلــێن دنیــا کــا و بایــە
بـــاکەی گڕەیـــە و کـــای لـــە چـــاومایە
خۆشـــی کـــەلامێ شـیـــرین بـــوو بیـــستم!
تـــاڵی دەمـــاری لـــــە هـەناومـــــایە

﴿ ٧ ﴾

هــاواری نــاخم ناگاتــە گــوێی کــەس
گوێـشم لـە قیـژەی ناکـەس بـوو وەڕەس
لانــەی پــەپو و مــار لــە بــاخ و دەشـــتا
بولبـولیش حەپـسە لـە گۆشـەی قەفـەس

﴿ ٨ ﴾

هــەتا تــۆ ســاقی مەجلیــسی ئێمــەی
لـە سـەیری چـاوت ســەرخۆشین بـێ مـەی
مــوفتی گوفـــتی دا کــە مــەی حەرامــە
بــێ پیاڵــەی دیـدە و گــەردنی شــوشەی

﴿ ٩ ﴾

سـەیری چاوت بادەمە هەم بادەمە
دەمت خونچەی نێو باخەکەی ئێرەمە
گووتم بمکە غولامی بەر دەری خۆت
گووتی ناشێ ئەو ڕوتبەیە ئەستەمە

﴿ ١٠ ﴾

ساقی مەیێکم دەرێ ئەقڵ و هۆشم لابەرێ
وەختە دڵ بێتە دەرێ فیداتم زوو بمگەرێ
لە نەبوونەوە بۆ بون لە بوونەوە بۆ نەبون
ئاشی گەردوون لە پاشی هاڕینیش لێم ناگەڕێ

﴿ ١١ ﴾

دنیـــا وەك خێـــری ریـــا بـــەش كـــرا
هەنـدێ گۆشـت هەنـدێ ئێـسكی پـێ درا
هەنـدێ بـەس دوكـەڵ چـوو بـە چـاویانا
هەنـــدێكیش تـــەنها بۆنیـــان پـــێ بـــڕا

﴿ ١٢ ﴾

هەنـــدێ خوازیـــارە بەمـــەرگی بۆچـــی؟
هەنـــدێ بەهەشـــتە ژیـــان و كۆچـــی!
لـــە ژیـــن و مـــەرگ و بەهەشـــت و دۆزەخ
دڵـــە پـــێم بڵـــێ ئـــەی بەشـــی تۆچـــی؟

﴿ ١٣ ﴾

وەك چـــاوی نـــابین تامـــەزرۆی رەنگـــم
وەك گوێـچكەی نابیـست پەرۆشـی دەنگـم
وەك زوبـــانی لاڵ پـــڕم لــــە هـــــاوار
قــەت نــاگەم بــە ڕۆژ وەك شــەوە زەنگـم

﴿ ١٤ ﴾

چــوومە گوڵـستان شــیوەنی گــوڵ بــوو
قاقـــای دڕك و ئـــەهلی بـــێ دڵ بـــوو
ناڵـــەی بولبـــولی لــــە قەفـــەز كـــراو
مـــەزە و گــۆرانی قــەلی ســـەر چــڵ بــوو

﴿ ١٥ ﴾

بــۆ دڵ شــکاو و چــاو پــڕ لــە ئەشــك
مەیخانــە خانــەی فەرەحــە بــێ شــك!
ئــەمڕۆ دڵ خــۆش بم ســبەی جەهەننــەم
بــەهەشت پێـشکەشی سـۆفی بێ مێـشك

﴿ ١٦ ﴾

تاکـــەی وەك یاشـــێخ خـــزاوی مـــاڵم
خـــەریکی نوشـــتە و کایـــەی منـــاڵم
خـــۆ مـــن زاهیـــدی خـــودا پـــێ داو نـــیم
حـــەرامی خـــەڵکی بـــبێ حـــەلاڵم

﴿ ١٧ ﴾

هەرکاتـــێ دەچـــمە بـــەر دەم ئاوێنـــە
بـــۆ ڕووی ئاوێنـــە دڵـــم پـــڕ خوێنـــە
یـــاخوا ئاوێنـــە هـــەر مـــن بتبیـــنم
بـــەو ڕەنـــگ و شـــێوە بـــەو حـــاڵ و وێنـــە

﴿ ١٨ ﴾

چـــەرخ دەســـوڕێ مـــن هـــەر وەستـــاوم
یـــا بـــەرەو پاشـــە ڕەوتـــی هـــەنگاوم
تەمـــەن زوو دەڕوا کـــە بـــەهیچ ناگـــەم
درێـــژە یـــاخود خـــۆم ســـست و خـــاوم

﴿ ١٩ ﴾

نـــــانێکی رەق و پەرداخـــــــە ئـــــــاوێ
کـــــەلاوە کــــــۆنێ چـــــرا شـــــکاوێ
گــەر مــوڵکی مــن بــێ بــە دڵێکــی شــاد
حاشـــــابێ قەســــری شـــــاهانم نـــاوێ

﴿ ٢٠ ﴾

لـە ناڵـەی قـومری و لـە چـریکەی بولبـول
لـــە گـــەڵای خـــەزان لـــە ژاکـــانی گـــوڵ
لـــە دەنگـــی دەف و لـــە شـــیوەنی نـــەی
تێدەگـــەم نـــاژی کـــەس بـــە کـــامی دڵ

## ﴿ ٢١ ﴾

بولبول قەفەزی گەر زیوی رووتە
داخی بۆ لانەی دار ژەقنەبوتە
مادەم سەربەستە لە کوێ دەربەستە
گەر ئەڵماسیش بێ تابووت نابووتە

## ﴿ ٢٢ ﴾

کە دولبەر ماچی دەمی خۆی پێم دا
هەقی بوو قازی سەد داری لێم دا
ئەگەر من بە دڵ ئاشقی گوڵ بم
چ باکمە دڕك بچێ بە پێم دا

﴿ ٢٣ ﴾

ئای چەن شەوی بێ ئەستێرەم تێ پەڕان
چەندە ڕۆژی بێ ڕۆژم بە شەو گەیان
تەمەنێکی پڕ تەمەننام بەڕێ کرد
خونچەی هیوام چەن دا لە یەخەی خەزان

﴿ ٢٤ ﴾

دڵ ئەویندار تر بووە بەو هەموو برینەوە
وەکوو مێو گەشە دەکا بە سەر پەل بڕینەوە
دڵێ بەرد بێ ژەنگ ئەکا هەر گوڵە ئاونگ دەکا
ئێمە گەردی ڕۆژگار بەئەسرین ئەسڕینەوە

﴿ ٢٥ ﴾

پـــایز ئاوێنــــەی رەنگـــی پـــەڕیوم
دایـــەنی کۆرپـــەی دڵـــی هــــەتیوم
بێـــرەوە تخـــوا بـــەهار بـــەمن چـــی
کـــەمن لـــە سایـــەی ئـــەودا وەریـــوم

﴿ ٢٦ ﴾

تـــوڕەم لـــە تـــوڕڕەی پەرێـــشانی یـــار
کـــە رۆژی روونـــی لێ کردمـــە شـــەوگار
مـــن بـــە ئـــومێدی بۆســـەی لـــەبی چـــووم
کەوتمـــە نێـــو بۆســـەی زوڵفـــی تـــار و مـــار

﴿ ٢٧ ﴾

ئەتۆ خۆر بوویت کەچی رۆژت ڕەش کردم
ئەتۆ مانگ بووی لە جوانیت بێ بەش کردم
تۆ بەهار بووی خونچەی دڵمت هەڵوەران
ئەتۆ ژین بووی مردنت پێش کەش کردم

﴿ ٢٨ ﴾

ئەمن سەحرا بووم بوومە ئاوی ژینت
ئەمن خار بووم ئەمما بوومە پەرژینت
من بێ جێ بووم دڵم بۆ کردیە لانە
ئەمن خۆشیم دەگۆڕیەوە بە شینت

﴿ ٢٩ ﴾

ئــەتۆ لــە نێــو گوڵــدانی دڵمــا شــین بــووی
گەرچی بۆ من سەرچاوەی خەم و شین بووی
رەوایــــە گـــەر بـــە وێنـــەی گـــوڵ و بـــاران
لــە پاداشــتی گریــەم دەم بــە خــەنین بــووی

﴿ ٣٠ ﴾

ئـــــەمن رســـــتەی زمـــــانێکی پـــــڕ گـــــریێم
چـــــــرایەکم رۆژی روونـــــــاك دەگـــــــرێم
نیگایـــــەکم چـــــی دەبیـــــنم دەریایـــــە
کۆچـــــەرێکم ســـــەرایە کـــــوێ دەگـــــەڕێم

﴿ ٣١ ﴾

بـۆ ئـەم جەژنـە چ خـەمێکم لەبـەر کـەم
بـەنێو کوچـەی کـام ئـازاردا گـوزەر کـەم
لەگــەڵ کێــدا بــچمە باخــچەی ئــاژەڵان
لایــان باســی درِنــدەیی بەشــەر کــەم

﴿ ٣٢ ﴾

هــەر قــەترە ئەشــکێ لەدیــدەم دەردێ
دەبێتــە مەرهــەم بــۆ زامــی دەردێ
لێگــــەڕێ بگـــــریم بەســــەر زامانـــــا
زەمــــەن دڵێکـــی دەوێ لـــە بـــەردێ

﴿ ٣٣ ﴾

خـاڵی گـەردنت کـەوا بەوێنـەی خـاڵی کـەوە
دەرکەوە دڵ لــەدەردی تەنیایی خاڵی کـەوە
واجبـی مـن تـەوافی ئـەو کـۆڵان و دەرکەیـە
قیبلەی قەلبی حەزینم دەرکەوە لە دەرکـەوە

﴿ ٣٤ ﴾

چـاو بەئەشـك و لێـو بـەئاه و بـار نـەبێ
دڵ بــەدەردی ئـــــەوین گرفتـــار نـــەبێ
رۆشـــن نـــابێ چـــرا دەوری تـــار نـــەبێ
کەهــەر دەمــرم بـۆ بەخــەمی یـار نـەبێ

﴿ ٣٥ ﴾

بەسەرما بەفری خەم باری نەهاتی
بە یادی لاوی بۆ یاری نەهاتی
لەرێتا فەرشی لالەی ئەشکم راخست
بۆ سەیر و سەفای بەهاری نەهاتی

﴿ ٣٦ ﴾

دڵم پڕەو هەگبەم خاڵییە چ بکەم
عومری شیرین سەرفی تاڵییە چ بکەم
سەرقافڵە بووم کەچی لە کاروان جێمام!
سەرم قاڵی دەس بەتاڵییە چ بکەم

﴿ ٣٧ ﴾

بــاری کێــوت دا بەســـەر شــانی دڵمــا
خـــەزانت دا بەســـــەر بـــەهار و گوڵمـــا
مــن کــە گـــەروم تینــوی دڵۆپــێ ئــاو بــو
دەریــات خولْقانــد لەئەســرینی بـــەکوڵما

﴿ ٣٨ ﴾

ئەگـــەر بــرۆت تــاق و میحرابـــی نویــژە
لەبەرچـی چـاوت وا مەسـت و خـوێن ڕێـژە
رۆژی بــەختی وەســڵی مــن کورتــە داخــۆ
یــا شـــەوی هیجــری زوڵفــی تــۆ درێــژە

﴿ ٣٩ ﴾

بـــە نـــاو ســـەرابی عـــومری خـــاڵی دا
بـــە نـــاو ئـــــازار و خـــەم و تـــاڵی دا
دەگــــەڕێم مــــنی رێبـــــواری نــــامۆ
بەشــــوێن خــــەونێکی دەم منـــاڵی دا

﴿ ٤٠ ﴾

چـــاوی هیـــوام بـــەخودا هێنـــدە کـــزە
لەســـەر لێـــوی ســـبەی نـــابینم بـــزە
ڕۆژ کـــە خـــەو دەمباتـــەوە ســـەیر نییـــە
شـــەو کـــە بێـــداری لەنـــاڵەم عـــاجزە

﴿ ٤١ ﴾

لـــەنێو گێــژی ئـــازارا بـــێ دەوا خـــۆم
دەستی خەم دەمژەنێت و بێ سـەدا خـۆم
مــن کــە بــە گــژ شــێری مــەرگا دێمــەوە
تـــازە تـــەفرەی ڕێــوی زەمانـــە نـــاخۆم

﴿ ٤٢ ﴾

زەمانـــــێ زمـــــانی شـــــیعرم زوڵاڵ بـــــوو
وەلـــێ لەوەسـفی جـوانی تـۆ زوو لاڵ بـوو
بــە یــادی پیاڵــەی چــاوی تــۆ ئــەزیزم
پێکـی تـاڵم چـەندە شـیرین بـەتاڵ بـوو

﴿ ٤٣ ﴾

تابووتـــێ گـــووتی بـــە مـــردوو شـــۆرێ
چـــەن بـــە نـــابووتی دەوران ئـــەگۆڕێ
ئـــەمن دارێ بـــووم جێژوانگـــەی یـــاران
ئێـستە مـردووم پـێ دەبـەن بـۆ گـۆڕێ

## ﴿ شیعرە ئازادەکان ﴾

### ﴿ ١ ﴾

شەوە ئازیز

شەوی پاییز

چرکە ماندووی ڕێگەی دووری دەقیقەیە

کات هێندە بێ سەلیقەیە

ناچێ بەدەم گزنگەوە

ئاخ بە دەس شەوە زەنگەوە

داری عومرم پەیتا پەیتا

لەبەر ڕەشەبای مەینەتا

گەڵای خەونی هەڵدەوەرێ

بێداری سەگێکی دڕە

تاکو بەیان پێم دەوەڕێ

دڵم هەناری ژەنگ گرتووی

سەر چڵێکی بێ گەڵایە

کرمێی زەردەواڵەی خەم و

کرمی ناسۆری و بەڵایە

کووره هەنگی کاسەی سەرم
وروژاوی سەد پرسیاره
بەڵام ئازیز
ئەوەی زێتر بەئازاره
لەسەر تەرازوی ئەم شاره
کەوتنی مرۆ و گەڵایه
بەهەمان سەنگ و بەهایه

***

﴿ ٢ ﴾

من گومانم لە یەقینە و
قینم لە ئەوین هەستاوە
ئەوە نییە تۆ ڕۆشتوویت و
ژیان هەر وەکوو خۆی ماوە

ئاخر گیانە
من کە دەمگوت
شا دەماری
خوێن بەری دڵ و گیانمی
لەجێی دیدە و
هەناسە و نان و ئاومی

بڕوا بکە
گشت درۆ بوو
درۆی کەسێکی بەد گۆ بوو

ئاخر کەسێ بێ رۆشنایی و
بێ هەناسە و نان و ئاو بێ
مەگەر بوتی بێ هەناو بێ
چلۆن دەتوانێ رێ بکا
لەنێو کلّپەی ئاگری بیرەوەریتا
چۆن دەتوانێ
هێلانە بۆ خۆی چێ بکا

***

﴿ ٣ ﴾

وردە وردە وەختە رادێم
لەگەڵ خەم و ئازارما
لەگەڵ خەمی لە مێژینە و
ئازاری دڵی زارما
لەگەڵ بێداری شەوان و
تەمەنی بێ بەهارما

ئاخر گیانە
تازە تەمەن چی دی ماوە
کۆشکی ئەوین وا رماوە
ئێستا بووە بەکەلاوە

جاران گزنگ بەر لە هەرجێ
لەماڵی من خۆی وێی دەدا
پەردەی ژورەکەی لادەدام
وادەی رۆژێکی نوێی دەدا
دەنگی جریوەی پاساری و
بۆی تەنوری نانی تازە

بەتاسەوە دەیبردمە نێو
دەرك و حەوش و دەروازە

جاران باران
دەیدا لە ئینجانەی دڵم
دەیشۆردەوە
گەڵای سەوزی کەف و کوڵم
بەڵام هەیهات !
ئێستا نەهات
لە ژوور سەرم پاڵ کەوتووە
مەلی هیوام شەوارەیە و
لەماڵێ بێ باڵ کەوتووە
شەو و ڕۆژم ئێستا دەڵێی
ملوانکەیەکی پساوە
لێ نازانم
چەندی فەوتا و
چەندی ماوە

***

﴿ ٤ ﴾

من خۆم زامم قەسیدەیە و
خوێنم حیبرە و دڵم شوشە
بەختم ئاسمانێکی تاری
پڕ ورشەی ئەستێرەی وشە

وەلـێ جەخار
ملوانکەی هەستم پساوە و
مەلی روانینم شەوارە
زارم بەستراوی نزای
رازێکی پڕ لە ئازارە
دەستی رێشم چەن دەگێڕم
بەقوڵایی ئەم ئێشەما
هیچ هەڵبەستێ نایە بە ناو
بیر و زهن و ئەندێشەما
ئاوێنەی خەیاڵ بە ژەنگی
دڵ تەنگی بومەلێڵ بووە
وێنەی لاویم

لەباخەڵی
چۆغەی پیریما وێڵ بووە

دەسا ئازیز تۆ پێم بڵێ
چییە تەفسیری ئەم خەونە
لەناو ئامێزی ئەم کەونە
من چیم و کێم؟
گوڵی ئاڵی ئاون گرتوو
یا زامی پڕ لە خوێن و کێم

﴿ ٥ ﴾

ئەی خودایە

چاوم لەنم پڕ بکەوە
خاکی دڵم تەڕ بکەوە

سەرم نەوی ئەرز کەوە
دەستی نزام بەرز کەوە

دوورگەڕیکە نیگاکانم
بەرزە فڕکە نزاکانم

هەتاکو عەرش نەوەستن
هەر بەخۆتەوە پەیوەستن

ئاگری ئەوینم خۆش کە
کڵپەی ئارەزوم خامۆش کە

ئازاری پەپولە نەدەم
نەمکوژیٚ ئازاری نەدەم

گوفتارم بکە ئاوێنە
ڕەفتارمی تێدا بنوێنە

سەری ڕەفتار نەنەوێنم
سنگی گوفتار دەرپەڕێنم

***

﴿ ٦ ﴾

هەمو شەوێ بەر لە خەوێ
پەرداخی پڕ داخی دەروون
دەخۆمەوە

مەستم ناکا پەستم دەکا
کە دەبینم
وەحشی لە هەموو خۆشییەك
نزیك لە دنیای خۆمەوە

***

﴿ ٧ ﴾

دڵێ کەمە

بۆ ئەم خەمە

بۆیە گوڵم

من دوو دڵم

بڕوا ناکەم

تۆ رۆشتبیت و من مابم

هەر چاوەڕێم

بانگم کەیت و لە خەو رابم

ئاخر گیانە

بیرتە یا نە ؟!

پێت دەووتم

هەردوو باڵی یەك باڵدارین

ڕۆح و جەستە

شیعر و بەستە

**بەهار و گوڵ**

**ڕیشە و دارین**

**ماسی و ئاوین**

**بێ یەك نابین**

**بۆ یەك ماوین**

﴿ ٨ ﴾

بەختەوەری
هێشتا لەلای من چرۆ بوو
وەرزێکی پڕ لەدرۆ بوو
زوو هەڵوەری

مەینەتیم دار سنەوبەرە
هەر چوار وەرزە سەوز و تەڕە

کوندەپوی خەم بۆ هەمیشە
هێلانەی تیا چێ کردووە
کۆتری هیوام بەسەر هێلکەی
خەونەکانێوە مردووە

***

﴿ ٩ ﴾

**پێم نەوتی باوانەکەم**

**با وانەکەم**

**یار و ئەغیار**

**بەم ئەوینەمان پەی بەرێ**

**کۆرپەی دڵم**

**ژێر بکەوە و**

**لەباغی سینەت بەی بەرێ**

﴿ ١٠ ﴾

هیچ شەرابێ ئەم سەرابەم
ناکاتە ئاو
هیچ مەستییە ئەم پەستییەم
نابا لەناو

قەڵەم باری ئەم ئەلەمە
هەڵناگرێ
هەستی دەروون لەسەر زارم
بۆتە گرێ

هیچ گزنگێ
ئاونگی گۆنام ناسڕێ
کوندەپوی خەم لەوێرانەی
دڵم هەرگیز هەڵنافڕێ

هومای بەختم بەندە لەنێو
قەفەسی قەدەری شوما
گورگی ئەجەل وێڵە بەدوی
کەروێشکی رووحی ماندووما

دەترسم نەتوانم پرچی
ئاڵۆزی هەستم شانەکەم
بەقەڵەمی خەدەنگی تۆ و
خوێنی جگەر
ئەم ئازارە ئینشا نەکەم

***

﴿ ١١ ﴾

نازدارکەم
هەتوانی دڵە زارکەم
لە گوێسوانەی لێوی شەقار شەقارما
لە پایزی روخسارما
تۆ گوڵی ئاڵی خەندەمی
بۆ کێڵگەی برینی لەشم
تۆ هەم لۆکە و هەم مەرهەمی

تۆ تا ئێستاش بەرگی شڕی
تیفلی دڵم پینە دەکەی
بە چڵی رووتی ژینمەوە
لەو کۆترە غەمگینە دەکەی
تەوقی خەمی لە ملایە
کەچی هێشتا بێ پەروایە
لەگەڵ گزنگی بەیانا
وێڵە بەدوی لەتێ نانا

تا بیداتە بێچوی رووتی
ئەگەر چی سوریش دەزانێ
شین دەکا لەسەر تابووتی

نازدارکەم
ئەمجار سەختە ئازارەکەم
چیدی بارانی فرمێسك
بۆ ماسی رووحم مەڕێژە
گوڵی هیوات لە گوڵدانی
بێ هودەیی دا مەنێژە
لێگەڕێ رەشەبای ئەجەل
رەگ و ریشەم هەڵبکەنێ
هەتاکوو کەی
دەستی پیریم
کۆرپەی ناخم رابژەنێ ؟!

***

﴿ ١٢ ﴾

ئەی دار بەڕووی سنگ دەرپەڕیو
بەرامبەر ڕەشەبا و زریان
تۆ هەر بەو تەورە دەکەوی
کلکی لە پەلی خۆت بڕییان

من نازانم ئەشکم بسڕم
یا ئارەقەی نێو چەوانم !
بگریم! یاخود خەجاڵەت بم ؟
بۆ بێکەسیم
یا بۆ ناکەسی کەسانم

***

﴿ ١٣ ﴾

تۆ مەینەتی خۆشی ژینی
ئاگری کوانوی ئەوینی
لەیلایەکی ئەوەند شۆخی
سەد هێندەی شیرین شیرینی

بەڵام من مەجنونی بەڵام
بەبێستونی فەرهادەوە
زارم زارم بەنەغمەی
زاری و شیوەن و دادەوە

خۆزگە دەتزانی گوڵەکەم
چەند پەشێو حاڵە دڵەکەم

وەکوو زوڵفت نا کاکۆڵت
روو زەرد و پشت گوێ خراوم
مەگەر خەم ماڵی ئاوابێ
دەنا تەنیا و ماڵ خراوم

لەنێو خەیمەی کۆنی سەبرا
کە بە بای دڕی خەم دڕا
تاشەو پرچی سپی دەکا
تا ئەستێرە دەکوژێتەوە
ئەمن زامیٚ رادەژەنم
بەمەرهەمیش دەکولێتەوە

دیمەنی گزنگی رۆژ و
زەردەپەڕی لای ئێوارە
ئەمم دەلاقەی تەم گرتوو
ئەوم دیوارە دیوارە

پەیمانەکەی دەستم خاڵی
جامی دڵ لێو رێژ و پڕە
خەندەم لەبەر بارانی چاو
وەك هەتیوی بەرگ شڕە

**هەنگاوی لەنگم دەمباتە**

**سەر شارێی سەختی تەنیایی**

**کەتەنیا بە قەتعی نەفەس**

**دێتە پایان و کۆتایی**

**بەڵێ ئەمن سەرابێکم**

**لەدوورەوە ئاو دەنوێنم**

**مەپرسە لە ناونیشانم**

**چونکە تینوێتیت ناشکێم**

﴿ ١٤ ﴾

ئەی بێ مەئوا
لەسەر شۆشتەی تۆز لێ نیشتوو
لەبەر سەرما
بنو ئارام

خۆمن لەنێو نوێنی گەرما
هەتا بەیان بەبێ ئاکام
هەر بەئاگام

خەیاڵی بێ هودەیی ژین
وا دەماغ و دڵم دەخوا
چاوەڕێی رۆژی بێ رۆژم
تا شەوی بێ خەوم دەڕوا
تۆ هەمو دەمی بێداریت
مەودای لێك نانی پێڵوتە

بەڵام بەخوا
من زۆر شەوان
تاکو بەیان
هێند دەجوڵێم
نوێنی بێ هەست
لێم لالوتە

خۆزگە منیش لەبەر بایە
سەر شۆستەیە جێگام بایە
بەس وەك تۆ دڵێکی گەرم و
سەرێکی بێ ئاگام بایە

***

﴿ ١٥ ﴾

ڕۆڵە مەگری
لەگەڵ ئەم بێ بەرگییە رابێ
ئاسودەیی پۆشاکێکە
بۆ بەری هەژاران نابێ

قەیدی چییە !
با کوکوختی دڵی ئێمە
هەر نەغمەی حەزین بخوێنێ
با بازی خەم یەخەی بدڕێ
سوربێ سوری کا لەخوێنی

با ئەمڕۆ لانەمان تەنگ بێ
زەوی و ئاسمان
هەرا و جەنگ بێ
باڵی فڕەمان با لەنگ بێ
سبەی زوو یا خود درەنگ بێ

دوندی چیای شادی دەبڕین

ئیدی بەئازادی دەفڕین

ئەودەم چاوی تەڕمان دەسڕین

دوور دەبین لە خەم و ئەسرین

جارێکی دی دەستی مەرام

بۆ بردنی سێوی حەرام

درێژ نابێ

ئیدی کەس جێی پێ لێژ نابێ

***

﴿ ١٦ ﴾

خۆشەویستم
بۆ لەمەرگ نیگەرانی ! ؟

کە دەزانی
لەناو جەنجاڵی مەحشەرا
لەگرۆی پەری و بەشەرا
من هەر سۆراغی تۆ دەکەم
چونکە دڵە رەنجەڕۆکەم
بەبێ تۆ ئارام ناگرێ
نەوەك بەهەشت
لە فیردەوسیش
دەبێتە کورەی ئاگرێ

جا کە وابێ
گڕی فیراق بەجۆش ترە
هەر ئامێزی تۆ خۆشترە

**خوا نەکردە دۆزەخیش بی**

**هەر دێم لەدووت**

**لەویێ لەناو کڵپەی گڕا**

**بەهەشتێ ساز دەدەین بەجووت**

***

﴿ ١٧ ﴾

من لە دنیای روحی خۆشما
نامۆ و بێ جێم
شەوان لەسەر شۆستەی ساردی
خەیاڵێکدا هەڵدەلەرزێم

لەناو نوێنی گەرم و نەرما
وا هەست دەکەم کە کۆڵبەرم و
هەرەس هاتووە بەسەرما

رۆژیش لەو دیو
پەنجەرەی نیوە لێڵەوە
لە ژورێکی تەنگ و تاری
وەکوو گۆڕی بێ کێلەوە

چون بەردی برنجی سەر سینی
ورد ورد چرکەکان دەبژێرم
گوێ بۆ گمەی کوکوختی غەمگینی دڵم
رادەدێرم

ئێوارانیش مەراقی سارد و مەیوی
دوێنیێ و پێرێ دەنێمە سەر
خۆڵەمێشی کوانوی لاویم
هەر دەخۆم و دەخۆمەوە
لەسەر سفرەی پڕ بە پیتی
خەمی بێ پایان و دووایم

***

﴿ ١٨ ﴾

شەوە لەگەڵ بێداری و خەم
بەپێکی تاڵی هۆشیاری
سەرقاڵ دەکەم
تا بە پیاڵەی ئاڵی دیدەم
جامی دڵم بەتاڵ دەکەم

شەوە کۆرپەی وڕك گرتووی
ئەم ئازارەم پێ ژیر نابێ
لە بازاڕی ئەم ژینەدا روحم بایی
کڕینی ژەمێ شیر نابێ

شەوە و دێرە بنو لە نێو
لانکەی قووڵی برینما
بەلکو خوایە سبەی گزنگ
رۆژێ نوێ هەڵبێ لە ژینما

***

﴿ ۱۹ ﴾

ئەم وڵاتە شەوانی بێ ئەستێرەیە و
ڕۆژەکانی بێ ڕۆشنایی
ملی هەر ڕێگەیەك دەگری
دەچێتەوە سەر تەنیایی

ئەوین خەنجەری ژەهراوی
لەپشتەوە لـێ دراوە
مەرهەم لە ڕەچەڵەکی زامە و
هیوا بێ هیوا کراوە

کانی ئەگەر نەڕژێتە ناو
حەوشە و باخی سوڵتانەوە
سەرچاوەکەی لیخن دەکەن
بەناوی نیشتیمانەوە

گەنم هەرچەندە لە کێڵگە و
بارانی ئەوان حاشا کا
دەبێ هەر سەر سەر بە ناو ئاشی
نەزانی ماڵی پاشا کا

دەستی قڵیشاو و ماندوو
هەر لەسەر سکی برسییە
چونکە خێر و بێری وڵات
بۆ خاوەن سوڵتە و کورسییە

نیشتیمانم برینێکە
بەسەر جەستەی گەردوونەوە
بۆتە کاڵایە بێ نرخ
بەدەس مەردومی دونەوە

***

﴿ ٢٠ ﴾

هونەرمەندێکی دەس رەنگین
لە سەر لەوحەیەکی بەردین
کێشای تابلۆی منی غەمگین

دوای تێکەڵ بوونی چەند رەنگێ
بە دەست و پەنجەی وێنەکێش
سەرەنجام روخساری تابلۆ
هەر دەبۆوە بە خۆڵەمێش

***

# ﴿ كۆپلە و تاكە بەيت ﴾

﴿ ١ ﴾

زۆر گوڵی جوان
لەسەر سنگی بەرد رواوە
تۆ كە خۆت گوڵی لەبەر چی
بەردت لەسینەت داناوە ؟!

﴿ ٢ ﴾

ئەتۆ جارسی پەرچەمت كە شێواوی دەستی بایە
ئەی ئەگەر وەك من ژیانت شێواوی پەرچەمێ بایە

﴿ ٣ ﴾

بە ئاگری غەم دەسووتێ پەروانە ، گەر شەم نەبێ
رەنگە ئاگری وەسڵ وەك فیراق ئەستەم نەبێ

﴿ ٤ ﴾

وا پیر بووم و هێشتا نامۆم بەم ژیانە
دێم و دەچم بەنــابەڵەد لە ئــازارا

وەك ئەو رۆژەی کەمنــداڵ بووم
دایکم ون کرد
لە نێو جەنجاڵی بازاڕا

﴿ ٥ ﴾

لەقەسیدەی عومری منـدا بـەیتێکی جـوانی تیـا نییـە
لەباخی نـاخی پڕ ئـاخم دوو کورسی ژوانـی تیـا نییـە